چیرۆکی پێغەمبەران

# چیرۆکی حەزرەتی عیسا

## (سڵاوی خوای لێبێت)

10


نووسەر : کەمال سەید

وەرگێڕانی : ئازاد عەبباس گڵێجاڵی






وێنە : حەسەنێین و تەییە عەبدوڵڵا

ناوی کتێب: چیرۆکی حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت)
ناوی نووسەر: کەمال سەید
وەرگێڕانی: ئازاد عەبباس گلێجاڵی
وێنە: حەسەنێین و تەیبە عەبدوڵڵا
نۆبەتی چاپ: دووەم/2022
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ: 1000 دانە
ژپنک (ISBN): 978-9922-626-65-9
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (1316)ـی ساڵی (2018)ـی پێ دراوە.






**ناوەندی ڕێنوێن**
 07701932749 - 07501269689
 hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com
 سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)



چیرۆکی پێغەمبەران

# چیرۆکی حەزرەتی عیسا
## (سڵاوی خوای لێبێت)

نووسەر : کەمال سەید
وەرگێڕانی: ئازاد عەبباس گڵێجاڵی
وێنە: حەسەنێین و تەیبە عەبدوڵڵا

10

## پێغەمبەر عیسا (سڵاوی خوای لێبێت)

خاتوو مەریەمی پاکیزە خەریکی خواپەرستی بوو.. تیشکێکی زۆر ڕووناک ژوورەکەی تەواو ڕووناک کردەوە.. لە ناوەڕاستی ڕووناکییەکەدا مرۆڤێکی بینی..

خوای گەورە کورتەی ئەو چاوپێکەوتنەمان بۆ دەگێڕێتەوە..

خاتوو مەریەم فەرمووی: ﴿إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمنِ مِنْكَ إِنْ كُنْتَ تَقِيّاً﴾ مريم: ١٨ واتە: من پەنا دەبەمە بەر خودا لە دەستی تۆ، سا ئەگەر تۆ خۆپارێزی لێم مەیە پێش.

ئەو کەسە کە لە نێو ڕووناکییەکەدا دەرکەوت، مرۆڤ نەبوو، بەڵکو فریشتەی خودا بوو..

فریشتەکە فەرمووی: ﴿إِنَّما أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلاماً زَكِيّاً﴾ مريم: ١٩ واتە: من لە لایەن پەروەرندەی تۆوە ڕاسپێراوم کە منداڵێکی پاک و خاوێنت پێ ببەخشم!.

خاتوو مەریەم لە شەرما سەری داخست و وتی: ﴿أَنَّى يَكُونُ لِي غُلامٌ وَ لَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَ لَمْ أَكُ بَغِيّاً﴾ مريم: ٢٠ واتە: من چۆن منداڵم دەبێ، لە کاتێکدا هیچ مرۆڤێک دەستی لە من نەداوە و داوێن پیسیش نیم؟!..

فریشتەکە فەرمووی: ﴿كَذالِكَ قالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَ لِنَجْعَلَهُ آيَةً لِلنَّاسِ وَ رَحْمَةً مِنّا وَ كانَ أَمْراً مَقْضِيّاً﴾ مريم: ٢١ واتە: فەرمان هەر ئەوەیە و پەروەرندەی تۆ وای فەرمان داوە، ئەوە لەلای من ئاسانە و دەمانەوێ چاکەیەک بێ لە ئێمەوە و نیشانەیەک بێ بۆ خەڵکی، ئەم فەرمانەش هەر دێتەجێ.

فریشتەکە دیار نەما.. خاتوو مەریەم هەستی دەکرد بە منالێکەوە دووگیان بووە..

## قەدی دارخورما

بەیانییەکی زوو خاتوو مەریەم ڕۆیشت بۆ لای تەپۆڵکە نزیکەکانی شار.. زۆر پەشێو و پەرێشان بوو.. بەڵام بڕوای پتەوی بە خوای گەورە، دڵنیایی و ئەرخەیانی پێ دەبەخشی و ئۆخژنی بۆ دەهات..

خاتوو مەریەم هەستی بە ناڕەحەتی کرد.. لە لای قەدی دارخورمایەکدا دانیشت.. ژانی منداڵبوون گرتی.. خۆی بە خۆی وت: ﴿يا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هذا وَ كُنْتُ نَسْياً مَنْسِيّاً﴾ مريم: ٢٣ واتە: خۆزیا هەر بەر لە ئێستا دەمردم و یەکجێ لەبیر دەچوومەوە..

خاتوو مەریەم بیری لەوە دەکردە داخۆ کێ بڕوا بەوە بکاکە بە بێ ئەوەی مێردی کردبێ و داوێن پیسیش نەبێ منداڵێکی بووبێ؟!.. لەو بیر کردنەوانەدا بوو کۆرپەلەی تازە لەدایک بوو هاتە قسە و فەرمووی: دایە! خەم مەخۆ.. خوای گەورە ئاوی بۆ تۆ هەڵقوڵاندووە، کەمێک ئاو بخۆرەوە!..

﴿وَ هُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُساقِطْ عَلَيْكِ رُطَباً جَنِيّاً * فَكُلِي وَ اشْرَبِي وَ قَرِّي عَيْناً﴾ مريم: ٢٥ـ٢٦ واتە: کۆتەرەی ئەو دارخورمایەش بهەژێنە، خورمای تازە پێگەیشتووت بەسەردا دادەوەرێنێ.. پاشان لەو خورمایە بخۆ و لەو ئاوەش بخۆرەوە.

خاتوو مەریەم هەستی دەکرد نیگەرانی و خەم و خەفەت لە دڵیدا دەڕەوییەوە و وەک چۆن ئەو ئاوە دەڕوا و دوور دەکەوێتەوە، ئاواش خەم و خەفەت دەڕوا و لێی دوور دەکەوێتەوە.



خاتوو مەریەم لە کۆرپەکەی پرسی: ئەی نەفەسی پیرۆزی خوا! ئێستا خەڵک چیم پێ دەڵێن؟!..

کۆرپەکە وتی: پێیان بڵێ: ﴿إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمنِ صَوْماً فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنْسِيّاً﴾ مريم: ٢٦ واتە: بەڕاستی من بڕیارمداوە و نەزرم کردووە بە ڕۆژوو بم بۆ خوای میهرەبانم، لەبەر ئەوە ئەمڕۆ من هەرگیز قسە لەگەڵ کەسدا ناکەم.



ئەو کۆرپەیە حەزرەتی عیسا مەسیح(سڵاوی خوای لێبێت) بوو..

پێی دەگوترا مەسیح.. مەسیح یانی کەسێ دەست بە شتێکا بهێنێ.. بۆیە وای پێ دەگوترا چونکە دەستی بەسەر هەر نەخۆشییەکدا بهێنایە، ئەو نەخۆشییە چاک دەبوویەوە و نەدەما..

عیسای مەسیح(سڵاوی خوای لێبێت).. عیسای کوڕی مەریەمی پاکیزە، بە بێ باوک لە دایک بوو.. بۆ ئەوەی ببێتە نیشانە و دەسەڵاتی خوای گەورە و میهرەبان و توانا.

خاتوو مەریەمی پاکیزە کۆرپەکەی هەڵگرت و هاتەوە بۆ نێو شار..

خەڵکی شتێکی سەیریان بینی!.. مەریەمی پاکیزە و خواناس کۆرپەیەکی لە باوەشە و بووە بە دایک!..

ئەم هەواڵە زۆر بە خێرایی بە هەموو کوچە و کۆڵانێکی شاردا بڵاو بوویەوە..

هەندێ کەس هاتن و دەستیان کرد بە قسەی ناشیرین و جنێودان بە خاتوو مەریەمی پاکیزە..

حەزرەتی زەکەریا(سڵاوی خوای لێبێت) گوێی لە قسە و ناو و ناتۆرەی خەڵکەکە بوو.. کاهینەکانی پەرستگاش هەواڵەکەیان بیست.. هەر لەبەر ئەوە حەزرەتی زەکەریا(سڵاوی خوای لێبێت) و کاهینەکان هەمووان پێکەوە ڕۆیشتن بۆ لای خاتوو مەریەم..

خاتوو مەریەم نوێژی بۆ خوا دەکرد.. منداڵەکەش لە لانکا بوو، دەتگوت گوڵی بەهارە و تازە دەمی کردووەتەوە..

یەکێک لە کاهینەکان قسەی دڵی زۆربەی کاهینەکانی کرد و وتی: ﴿يا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئاً فَرِيّاً﴾ مريم: ٢٧ واتە: مەریەم! هەرگیز لە تۆمان وا ڕانەدیت ئەم سەمەرەت لێ ڕوویدات!..

یەکێکی تریان وتی: ﴿يا أُخْتَ هارُونَ ما كانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَ ما كانَتْ أُمُّكِ بَغِيّاً﴾ مريم: ٢٨ واتە: خوشکی هارون! تۆ نە باوکت پیاو خراو بوو، نە دایکیشت داوێن تەڕ بووا!..

خاتوو مەریەم سەیرێکی خەڵکەکەی کرد و هیچی نەگوت.. تەنیا بە ئاماژە بە کاهینەکانی وت: قسە لەگەڵ ئەو کۆرپەدا بکەن!..

کاهینەکان سەریان سووڕما، وتیان: ﴿كَيْفَ نُكَلِّمُ مَنْ كانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيّاً﴾ مريم: ٢٩ واتە: جا چۆن لەگەڵ ساوای نێو لانک و بێشکەدا قسە بکەین؟!..

ئا لەو کاتەدا مۆجیزە و پەرجوویەکی سەیر ڕوویدا.. ئەو کۆرپە تازە لە دایک بووە هاتە قسە و فەرمووی: ﴿وَ إِنَّ اللّهَ رَبِّي وَ رَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ هذا صِراطٌ مُسْتَقِيمٌ﴾ مريم: ٣٦ ﴿إِنِّي عَبْدُ اللّهِ آتانِيَ الْكِتابَ وَ جَعَلَنِي نَبِيّاً * وَ جَعَلَنِي مُبارَكاً أَيْنَ ما كُنْتُ وَ أَوْصانِي بِالصَّلاةِ وَ الزَّكاةِ ما دُمْتُ حَيّاً * وَ بَرّاً بِوالِدَتِي وَ لَمْ يَجْعَلْنِي جَبّاراً شَقِيّاً * وَ السَّلامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدْتُ وَ يَوْمَ أَمُوتُ وَ يَوْمَ أُبْعَثُ حَيّاً﴾ مريم: ٣٠-٣٣ واتە: هەر خودایە پەروەرندەی من و ئێوە، سا هەر دەبێ بیپەرستن، ئەمە ڕێگایەکی ڕاستە... من بەندەی خودام، کتێبی بە خەڵات دامێ و منی کردۆتە پێغەمبەر.. لە هەرکوێش بم پێو قەدەمم پیرۆز دەکا، هەتا زیندووم نوێژ بکەم و زەکات بدەم.. گوێڕایەڵی دایکیشم بم، نەشیکردووم بە ملهوڕێکی سەربزێو.. سڵاووم لێبێ ڕۆژێ کە لە دایک بووم و ئەوێ ڕۆژێ کە دەمرم و ئەوێ ڕۆژێش کە دووبارە زیندوو دەکرێمەوە.



حەزرەتی زەکەریا(سڵاوی خوای لێبێت) وەک باوەڕهێنانێک بە عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) پێغەمبەر و قسەکانی سەجدەی بۆ خوای گەورە برد..

بەڵام جوولەکەکان بەردەوام ئازاری پێغەمبەرانیان دەدا.. حەزرەتی زەکەریا(سڵاوی خوای لێبێت)یان شەهید کرد.. ئێش و ئازاریان لەسەر خاتوو مەریەم زیاتر کرد.. خاتوو مەریەم زۆر دەترسا کوڕەکەی بکوژن، بۆیە وڵاتی بەجێهێشت و بەرەو وڵاتی میسر وەڕێ کەوت.

## گەڕانەوە

چەند ساڵێک تێپەڕی.. حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) گەورە بوو.. بوو بە لاویکی جوان و چالاک.. خاتوو مەریەم گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی..

ڕۆژێک حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) بە تەنیا لە پەرستگا دانیشتبوو، بیری لە نەتەوەی ئیسرائیل دەکردەوە.. دەیزانی کە ڕێی ڕاستیان ون کردووە و لەسەر گومڕایی دەژین.. حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) پەرستگای بەجێهێشت و بەرەو تەپۆڵکەکانی ئەو نزیکانە ڕۆیشت.. بیری لە چارەنووسی گەلەکەی دەکردەوە..

حەزرەتی مەسیح(سڵاوی خوای لێبێت) لە دڵی خۆیدا دەیفەرموو: باشە من چۆن پڕوپاگەندەی بەنی ئیسرائیل بگۆڕم بۆ تیشک و نووری خودایی؟!.

باشە من چۆن ئەو خەڵکە گومڕایە بگێڕمەوە بۆ سەر ڕێگای ڕاست؟!..

حەزرەتی مەسیح(سڵاوی خوای لێبێت) ماڵ و شوێنێکی نەبوو تێیدا بحەسێتەوە..

لە دەرودەشتدا شەوی بەسەر دەبرد..

کاتێکیش باران دەباری پەنای بۆ ئەشکەوت و کەورگەکانی ئەو دەوروبەرە دەبرد..

کاتێ برسی دەبوو لە بەروبوومی دارودەرختی ئەو دەوروبەرانەی دەخوارد..

مەسیح(سڵاوی خوای لێبێت) بەو شێوەیە بە سەربەرزانە دەژیا.. بەندە و گوێ لە مستی هیچ کەسێک نەبوو..

لە خودا نەبێ لە هیچ کەسێک نەدەترسا..

ئێوارە داهات.. دونیا تاریک بوو..

عیسای مەسیح(سڵاوی خوای لێبێت) پەنای بردە بەر بەردێک و لە پەنای بەردەکەدا ڕاکشا..

کاتێ حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) ڕاکشابوو تەماشای ئاسمان و ئەستێرەکانی دەکرد و بیری لە گەورەیی و دەسەڵاتی خوا دەکردەوە..

لەو کاتەدا فریشتەیەکی خوا هاتە خوارەوە بۆ لای حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت).. تیشک و ڕۆشنایی فریشتەکە تەواو ئەو ناوەی ڕۆشن کردبوویەوە و وەک ڕۆژی لێهاتبوو..

فریشتەکە بە حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت)ی ڕاگەیاند و پێی فەرموو: خوای گەورە فەرمانت پێدەکات بۆ ئەوەی پەیام و نامەی خوای گەورە بە خەڵک ڕابگەیەنیت!..

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) لەو کاتەوە هەستا و دەستیکرد بە ڕاگەیاندنی پەیامی خوای گەورە و بانگهێشتکردنی خەڵکی بۆ سەر ئایینی یەکتاپەرستی و ڕێگای ڕاستەقینە..



## بانگەوازی ئاسمانی

بازاڕ جمەی دەهات.. پڕ بوو لە خەڵکی.. عیسای کوڕی مەریەم(سڵاوی خوای لێبێت) هاتە نێو ئاپۆرای خەڵک و بە دەنگی بەرز بە خەڵکەکەی وت:

﴿يا بَنِي إِسْرائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللّهِ إِلَيْكُمْ مُصَدِّقاً لِما بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْراةِ وَ مُبَشِّراً بِرَسُول يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾ الصف: ٦

واتە: ئەی بەرەی ئیسرائیل! من پێغەمبەری خودام بۆ لای ئێوە، ئەو تەوراتە دەسەلمێنم کە لە پێش من هاتووە بۆ لای ئێوە؛ مژدەو لێبێ لە پاش من پێغەمبەرێک دێت ناوی ئەحمەدە.

دادوەر ڕاپۆرتی لە سەر حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) بەرز کردەوە.. لە ڕاپۆرتەکەیدا نووسیبووی: گەنجێک هاتووە بە ناوی عیسای کوڕی مەریەم(سڵاوی خوای لێبێت)، بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات.. خەڵک بانگ دەکات بۆ ئەوەی بڕوا بە خوا بهێنن و لە هەموو ئەو شتانە دوور بکەونەوە کە گیانی مرۆڤ پیس و پۆخڵ دەکەن.

کاهینەکانی جوولەکە پێش هەموو چین و توێژێک بە بانگەوازی حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) قەڵس و تووڕە بوون.. چونکە حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە دەبێ دڵدانەوەی هەژاران بکرێت و خۆراک و پێداویستی بۆ نەداران دابین بکرێت!..

سەرکردە و کاهینەکانی ئەو دەمەش، هەموویان دووڕوو بوون.. بە ڕواڵەت خۆیان بە باوەڕدار و خواپەرست پیشان دەدا.. بەڵام دیوی ناوەوە و ناخیان زۆر جیاواز بوو.. ئەوان بڕوایان بە خوا نەبوو.. بڕوایان بەوە نەبوو کە هەژاران و نەداران وەک مرۆڤ مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت!.



## کێشمەکێش

کاهینەکانی جوولەکە دەیانگوت: ئەگەر عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) پێغەمبەرە کوا پەرجوو و موعجیزەکانی؟.. خۆ پێغەمبەر موسا(سڵاوی خوای لێبێت) موعجیزە و پەرجووی زۆری هەبوو، کوا عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) چی هەیە؟!..

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد بۆ ئەوەی واز لە ڕواڵەت بێنن و ناخی خۆیان پاک و خاوێن بکەنەوە و بڕوایان بە خوای گەورە پتەو و بەهێز بێت.. بانگەشەی ئەوەی دەکرد تا خەڵکی گرنگی بە ڕۆح بدەن..

یەکێک لە جوولەکەکان وتی: دەی خۆ ڕۆح بریتییە لەو خوێنانەی کە لە ناو دەمارەکانی مرۆڤدا هاتوچۆ دەکات!..

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: مەبەستم لە ڕۆح وشە و فەرمانی خوایە!..

جوولەکەکە وتی: ئێمە لە تۆ تێناگەین!.. نازانین چی دەڵێیت و مەبەستت چییە؟!..

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) چەمییەوە و مشتێ قوڕی هەڵگرت و فەرمووی: ئەمە ڕۆحی تێدایە؟..

جوولەکەکان وتیان: نەخێر!..

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ئەی ئەگەر من فوویەکی پیا بکەم و بە ئیزنی خوای گەورە ببێ بە باڵندە، ئەو کاتە چی؟!..

دوایی حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) فوویەکی کرد بە قوڕەکەدا.. لە پڕ قوڕەکە بوو بە کۆترێکی سپی.. دای لە شەقەی باڵ.. لە ژێر ئاسمانی شیندا دەستیکرد بە گەڕان.. دڵی حەزرەتی عیسای پێغەمبەر(سڵاوی خوای لێبێت) پڕ بوو لە ملکەچی بۆ پەروەردگاری باڵادەست و بەدیهێنەرە و ئافرێنەر!..

## حەوارییەکان

گەلی ئیسرائیل بڕوایان بە حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) نەکرد.. کاهینەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر ڕقیان لە حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) هەڵدەگرت.. بەردەوام پیلانی تیرۆرکردنی حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت)یان دادەڕشت.. بۆیە حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) لە نێو خەڵکدا بە دەنگی بەرز فەرمووی: ﴿مَنْ أَنْصارِي إِلَى اللّهِ﴾ الصف: ١٤ واتە: کێ پشتیوان و یار و یاوەرمە بۆ ڕێبازی خوا؟..

دوانزە پیاو لە جێی خۆیان هەستانەوە و فەرموویان: ﴿نَحْنُ أَنْصارُ اللّهِ آمَنّا بِاللّهِ وَ اشْهَدْ بِأَنّا مُسْلِمُونَ﴾ آل عمران: ٥٢ واتە: ئێمە پشتیوانی دین و ئایینی خوای گەورەین، باوەڕی تەواومان بە خوا هێناوە، تۆش شایەتی ئەوە بدە کە ئێمە بەڕاستی موسوڵمان و ملکەچ و فەرمانبەرداریین!.

دوایی هەموویان تەماشایەکی ئاسمانیان کرد و وتیان: ﴿رَبَّنا آمَنّا بِما أَنْزَلْتَ وَ اتَّبَعْنَا الرَّسُولَ فَاكْتُبْنا مَعَ الشّاهِدِينَ﴾ آل عمران: ٥٣ واتە: پەروەردگارا ئێمە باوەڕمان هێناوە، بەوەی داتبەزاندووە و ڕەوانەت کردووە، شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکەشتین، دە تۆیش لە ڕیزی شایەتەکانی (گەیاندنی بەرنامەکەتدا) تۆمارمان بکە.

## عازر

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) هاوەڵێکی لاوی هەبوو بە ناوی عازر، ئەو عازری زۆر خۆش دەویست.. عازر لاوێکی بڕوادار و ڕاستگۆ بوو.. ڕۆژێک حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) ڕۆیشت بۆ ماڵی عازر و هەواڵی پرسی.. دایکی هاتە دەرەوە و دەستی کرد بە گریان.. وتی: عازر سێ ڕۆژە مردووە!..

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: بمبە بۆ لای گۆڕەکەی..

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) لای گۆڕی عازر وەستا و ڕووی کردە ئاسمان و دەستیکرد بە پاڕانەوە لە پەروەردگار و زۆری لێ پاڕایەوە.. دوای ئەوە حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: عازر هەستەوە!..

کتوپڕ خۆڵی سەر گۆڕەکەی عازر کەوتە جووڵە جووڵ.. گۆڕەکە درزی برد.. عازر زیندوو بوویەوە و لە گۆڕەکەی هاتە دەرەوە.. دایکی باوەشی کرد بە عازرا و پێک شاد و شوکور بوونەوە و لە خۆشیدا فرمێسک بە چاوەکانیاندا دەهاتە خوارەوە..

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) بە عازری وت: پێت خۆشە لە گەڵ دایکتدا بمێنیتەوە؟!..

عازر وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا!..





## خۆ بەکەم زانین..

خوای گەورە سرووشی بۆ حەوارییەکان نارد و فەرمووی: ﴿أَنْ آمِنُوا بِي وَ بِرَسُولِي﴾ المائدة: ١١١ واتە: دەبێ باوەڕتان بە من هەبێ و باوەڕ بە پێغەمبەرەکەیشم بکەن!..

حەوارییەکان وتیان: ﴿آمَنَّا وَاشْهَدْ بِأَنَّنا مُسْلِمُونَ﴾ المائدة: ١١١ واتە: خوایە تۆ شایەت بە، کە بڕوامان پێ هێنای و هەر ملکەچی فەرمانی تۆین!.

حەوارییەکان لە لای حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) کۆ دەبوونەوە و بڕوایان پێ دەکرد و پشتیوانییان لێدەکرد..

هەزارەکانی نەتەوە و گەلی ئیسرائیلیش وەک مەڕی سەرلێشێواویان لێهاتبوو.. کاهینەکانیش وەک گورگی باڵان دیدەیان لێهاتبوو.. هەژارانیان دەچەوساندەوە.. بڕوایان بە حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) و پەیامی خوای گەورە نەدەهێنا.. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دڕندەتر دەبوون..

ڕۆژێک حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) لە گەڵ حەوارییەکاندا ڕێی دەکرد.. گەیشتنە زنجیرە تەپۆڵکە و بەرزاییەک، کە چواردەوری شاریان گرتبوو.. لە نزیک کانی و ئاوێکدا دانیشت و حەوارییەکانیش لە لای دانیشتن.. حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) دەستیکرد بە شۆردنی پێی هاوڕێکانی.. هەموان سەریان لەو کارەی حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) سوڕما..

وتیان: قوربان بۆ وا دەکەی؟..

فەرمووی: دەمەوێ من چی دەکەم بۆ ئێوە، ئێوەش ئاوا بکەن بۆ خەڵک!.. دەمەوێ خزمەتی خەڵکی بکەن!..

## سفرە و خوانی ئاسمانی

حەوارییەکان برسی بوون.. حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) هەرکاتێ برسی بووایە لە بەروبوومی دار و گژوگیای کەژی دەخوارد..

حەوارییەکان بە حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت)یان وت: ﴿يا عيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَنْ يُنَزِّلَ عَلَيْنا مائِدَةً مِنَ السَّماءِ﴾ المائدة: ١١٢ واتە: ئەی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت)ی فرزەندی مەریەم! ئەرێ پەروەرندەکەی تۆ لە دەستی دێ کە خوانێکمان لە ئاسمانەوە بۆ بنێرێ؟..

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ﴿اتَّقُوا اللّهَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنينَ﴾ المائدة: ١١٢ واتە: ئەگەر باوەڕتان بە خوا هەیە لێی بترسن!..

حەوارییەکان وتیان: ﴿نُريدُ أَنْ نَأْكُلَ مِنْها وَ تَطْمَئِنَّ قُلُوبُنا وَ نَعْلَمَ أَنْ قَدْ صَدَقْتَنا وَ نَكُونَ عَلَيْها مِنَ الشّاهِدينَ﴾ المائدة: ١١٣ واتە: دەمانەوێت (بۆ پیرۆزی و بەرەکەت) لێی بخۆین و دڵنیابین و چاک بزانین کە بێگومان ڕاستت لەگەڵدا کردووین و لەسەریشی ببینە شایەت (تا ئەوەی باوەڕی هەیە باوەڕی دامەزراوتر بێت).

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) بە ملکەچییەوە سەجدەی بۆ خوای گەورە برد.. ماوەیەک لە سەجدەدا مایەوە و دواتر سەری بەرز کردەوە و فەرمووی: ﴿اللَّهُمَّ رَبَّنا أَنْزِلْ عَلَيْنا مائِدَةً مِنَ السَّماءِتَكُونُ لَنا عِيداً لِأَوَّلِنا وَ آخِرِنا وَ آيَةً مِنْكَ وَ ارْزُقْنا وَ أَنْتَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾ المائدة: ١١٤ واتە: ئەی خوای پەروەردگار لە ئاسمانەوە سفرە و خوانێکمان بۆ دابەزێنە تا ببێتە جەژن بۆ نەوەکانی ئێستا و داهاتوومان و بەڵگەیەک بێت لەلایەن تۆوە بۆ پێغەمبەرایەتی من و دەسەڵاتی بێ سنوورت و لە ڕزق و ڕۆزی بەهرەوەرمان بکە، هەر تۆی چاکترین ڕۆزی بەخش.

تیشک و ڕۆشناییەک ئەو ناوچەیەی گرتەوە کە ئەوانی لێبوو.. حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) و حەوارییەکان گوێیان لە دەنگێکی پڕ لە سام و هەیبەت بوو کە بە گوێی دڵی ئەوانیدا دەچپاند و دەیفەرموو: ﴿إِنِّي مُنَزِّلُها عَلَيْكُمْ فَمَنْ يَكْفُرْ بَعْدُ مِنْكُمْ فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذاباً لا أُعَذِّبُهُ أَحَداً مِنَ الْعالَمِينَ﴾ المائدة: ١١٥ واتە: بەڕاستی من ئەو سفرە و خوانەتان بۆ دادەبەزێنم، جا ئەوەتان (دوای دابەزاندنی سفرەوخوانەکە) بێ بڕوابێت و سوپاس ناپەزێربێت، ئەوە بەڕاستی من سزایەکی دەدەم کە سزای هیچ کەسێکم لە جیهاندا ئاوا نەدا بێت.

سفرە و خوانێک لە ئاسمان هاتە خوارەوە.. پڕ بوو لە خواردن و خواردنەوەی خۆش و پاک و چاک.. گۆشت و نان.. بۆنی خۆشی ئەو خواردنانە ئەو ناوچەیەی گرتبوویەوە.. ئەوانەی کە برسی و هەژار بوون هاتن و لەو خوانە پڕ لە فەڕ و بەرەکەتەیان خوارد.. هەموان سکیان تێر بوو..



## له کەناری دەریادا

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) ڕۆیشت بۆ قەراخی دەریا.. کاتێ ڕاوچییەکان چاویان پێی کەوت هاواریان کرد و بە دەنگی بەرز وتیان: مامۆستا هات!..

ڕاوچییەکان هەر هەموویان خەمبار بوون، چونکە ئەو ڕۆژە هیچیان دەست نەکەوتبوو.. نە ماسییەکی گەورە، نە ماسییەکی بچووک.. نە شتێکی بەکەڵک و سوود!..

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) سواری بەلەمی یەکێک لە ڕاوچییەکان بوو.. سەوڵی لێدا و بە ئاماژەی دەست فەرمووی: شوێنم بکەون!..

لە شوێنێکدا فەرمووی: ئا لێرە تۆڕەکانتان ڕاخەن..

ڕاوچییەکان هەموویان تۆڕیان ڕاخست.. پاش ماوەیەک تۆڕەکانیان هێنایە دەرەوە.. هەموو تۆڕەکان پڕ ببوون لە ماسی..

ڕاوچییەکان ئەوەندە خۆشحاڵ بوون خەریک بو لە خۆشحاڵیدا بفڕن!..



## چاکبوونەوە

ڕۆژێک حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) بە شوێنێکدا تێدەپەڕی.. چاوی لە کۆمەڵێ گەنج بوو گاڵتەیان بە کەسێکی کەڕولاڵ دەکرد.. پیاوە کەڕولاڵە داماوەکەش خەم و خەفەت بە دەموچاویەوە دیار بوو.. هەر سەیری ئەملا و ئەولای دەکرد..

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) لێی چووە پێش و دەستی خستە سەر سەری کوڕە کەڕولاڵەکە و دەستی هێنا بە سەر و گوێیدا.. موعجیزە و پەرجوو ڕوویدا.. گەنجی کەڕولاڵ هاتە گفتوگۆ.. گوێیەکانی بە باشی کەوتنە بیستن..

دواتر حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) پیاوێکی بینی تووشی نەخۆشی بەڵەکی ببوو.. خەڵک قێز و بێزیان لێ دەکرد.. بە بەرد لێیان دەدا و ڕاویان دەنا.. بۆیە وایان دەکرد بۆ ئەوەی ئەو پیاوە بەڵەکاوییە گوندەکە بەجێبهێڵێت و بڕوات..

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) دەستی پیرۆزی خۆی هێنا بە سەر لاشەی پیاوەکەدا.. پیاوەکە چاکبوویەوە و تەنانەت شوێنەواری بەڵەکیشی پێوە نەما..

## پیلانگێڕان

کاهینەکان خەڵکیان هان دەدا بۆ ئەوەی حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) بکوژن!.. لای دادوەری ڕۆم ـ کە ناوی فلاتوس بوو ـ سکاڵایان لە دژی حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) تۆمار کردبوو.. تۆمەتی کوفریان بۆ حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) هەڵواسیبوو.. داوایان دەکرد لە خاچ بدرێ!..

سەربازەکان حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت)یان دیل کرد و بردیان بۆ کۆشکی دادوەر..

دادوەر پێی وت: تۆ تۆمەتباری بە هاندانی خەڵکی لە دژی حکومەت!..

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: من داوا لە خەڵک دەکەم کە هەمووان بۆ یەکتر باش بن و مامەڵەی مرۆڤانە لەگەڵ یەکدا بکەن!.. دادوەر بۆی دەرکەوت بانگەوازەکەی حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) هیچ زیانێکی بۆ حکومەت نییە.. بۆیە فەرمانی ئازادکردنی حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت)ی دەرکرد..

بەڵام جوولەکەکان وازیان نەدەهێنا.. پەیتا پەیتا نامەیان بۆ قەیسەری ڕۆم دەنووسی و هانیان دەدا کە حەزرەتی عیسا مەسیح(سڵاوی خوای لێبێت) لە خاچ بدات.. تەنانەت تۆمەتیان بۆ دادوەر فلاتوس هەڵواسیبوو، دەیانگوت: ئەویش شوێنی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) کەوتووە!..

داوایان لە قەیسەر دەکرد کە فلاتوس لاببات و دادوەرێکی تر لە جێگەی ئەو دابنێت!..

فلاتوس لە ترسی ئەوەی نەوەک لە دادوەری لاببرێت، مۆڵەتی بە جوولەکەکان دا وتی: چی لە عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) دەکەن لێیی بکەن..

دوای ئەو بڕیارە جوولەکەکان وەک گورگی هاریان لێهات.. کوون بە کوون بە دوای حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت)دا دەگەڕان..

## ئێش و ئازاری مەسیح

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) ئازاری زۆری چەشت.. هەم خۆی و هەم دایکی ڕووبەڕووی سزا و ئێش و ئازار دەبوونەوە.. حەزرەتی مەریەم هەر لەو سەردەمەوە تووشی دژایەتی و ئێش و ئازار ببوو، کە ببوو بە خزمەتکاری (بەیتولمەقدیس).. کاتێکیش حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت)ی هێنایە دونیا، هەر تووشی ئازاردان ببوو..

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) لەملا دەڕۆیشت بۆ ئەولا.. لەولا دەهات بۆ ئەملا بۆ ئەوەی جوولەکەکان نەیکوژن..

شەوێک حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) و حەوارییەکان لە باخچەیەکدا خۆیان پەنا دابوو..

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) بە حەوارییەکانی وت: من هەواڵێکم پێیە.. پێتان دەڵێم: شوانەکە دەڕوا.. مەڕەکان بە تەنیا دەمێننەوە.. پێش ئەوەی کەڵەشێر بخوێنێ یەکێک لە ئێوە لە من هەڵدەگەڕێتەوە و تووشی کوفر دەبێت... حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) سێجار ئەو قسەیەی دووبارە کردەوە..

کاهینەکان دیارییەکی گەورەیان دانابوو بۆ ئەو کەسەی هەواڵێکی دروستیان لە بارەی حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت)وە پێ بدات.. دادوەریش فەرمانی دەرکردبوو کۆمەڵێک سەرباز لە خزمەت کاهینەکان بن و بە دوای حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت)دا بگەڕێن..

کات زستانە.. شەوە.. یەهودای ئەسخەریوتی بە پەنامەکی و بە دزییەوە ڕۆیشت.. خۆی گەیاندە کاهینی هەرە گەورەی ئەو شوێنە.. بیری لە دیاری و خەڵاتی کاهینەکان دەکردەوە.. هەندێک چپاندی بە گوێی کاهینەکەدا.. دوای ئەوە کاهینەکە هەندێ پارە و زێڕێ پێدا..

کەڵەشێر سێجار خوێندی.. خوای گەورە ویستی تۆڵە لەو کەسە خائینە بکاتەوە کە ناپاکی لەگەڵ حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت)دا کردبوو.. حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت)ی فرۆشتبوو بە هەندێ زێڕ و زیو..

خوای گەورە دەموچاوی یەهودای وەک دەموچاوی حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) لێکرد.. حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت)یشی هەڵکێشا بۆ ئاسمان..

## خاچ

لە ناو ئەو بێسەروبەرییەدا، ڕۆمانییەکان حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت)یان نەدۆزیەوە..

چاویان بە یەهودا کەوت، بینیان تەواوی تایبەتمەندییەکانی مەسیح(سڵاوی خوای لێبێت)ی تێدایە، یەهودایان گرت و بردیان.. جوولەکەکان دەیانویست بە زوویی لە مەسیح(سڵاوی خوای لێبێت) قوتاریان بێت، بۆیە یەهودایان برد و لەسەر گردی (جەلجەلە) لە خاچیان دا..

بەو جۆرە چیرۆکی حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) کۆتایی پێهات.

حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) مزگێنی ئەوەی دابوو کە دوای ئەو پێغەمبەرێک بە ناوی (ئەحمەد) دێت.. پێغەمبەری ئیسلامیش(درودی خوای لێبێت) مزگێنی ئەوەی داوە کە لە کۆتایی دونیادا حەزرەتی عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) لە ئاسمان دێتەوە خوار و دەبێتە هۆکارێک بۆ ڕزگاربوونی ئوممەتەکەی ئەو لە دەستی دەججالی درۆزن.. موسوڵمانان چاوەڕێن جارێکی تر و لە کۆتایی دونیادا بێتەوە سەرزەوی و مزگێنییەکەی پێغەمبەری ئیسلام(درودی خوای لێبێت) بەدی بهێنێت.



# چیرۆکی پێغەمبەران

10

قورئانی پیرۆز، ئەو کتێبەی کە خوای گەورە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەری ئیسلام(صلى الله عليه وسلم)، گرنگترین و ڕاستترین سەرچاوەی ژیان و بەسەرهاتی پێغەمبەرانە.. چونکە قورئان لە لایەن خوای گەورە و میهرەبانەوە دابەزیوە بۆ سەر پێغەمبەری ئیسلام(صلى الله عليه وسلم)..

بۆیە دەبێ ئێمەش قورئان بخوێنینەوە و لێی ڕامێنین و سوود لەو چیرۆکانە وەربگرین، بۆ ئەوەی ئیلهامی لێ وەربگرین و ڕێگای پرشنگداری پێ بدۆزینەوە..

ئەو ڕێگایەی کە بەرەو ئاشتی و ئەوین و خۆشەویستیمان دەبات.. بەرەو ئەو بیروباوەڕەمان دەبات کە هەموو پێغەمبەرانی بۆ نێردراوە..

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە لە قورئانی پیرۆز و تەفسیرە بەنێوبانگەکانی قورئان وەرگیراون.. بۆ ئەوەی گرنگی بە بیروباوەڕی منداڵانمان بدەین..





ناوەندی ڕێنوێن


07701932749 - 07501269689



hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)




9 789922 626659